


ئینستتیوتی بانگخوازان بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی

# پەیام و پێڕەو





پەسەندکراوی لیژنەی دەسەڵاتپێدراو بە

بڕیاری ژمارە(١)ی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن

لە ڕۆژی٨ی١ی٢٠١٦ زایین.




ئینستیوتی بانگخوازان بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی

# پەیام و پێڕەو

پەسەندکراوی لیژنەی دەسەڵاتپێدراو بە

بڕیاری ژمارە(١)ی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن لە رۆژی٨ی١ی٢٠١٦زایین.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾﴾ النحل: ١٢٥ - ١٢٨

# پێشەکی لیژنەی دەسەڵاتدار
# بۆ پەسەندکردنی ئەم پەیام و پێڕەوە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئێمە کە ئەرکی نووسینەوە و پوختەکردنەوەی پەیام و پێڕەوی ئینستتیوتی بانگخوازانمان خرایە سەرشان، زنجیرەیەك دانیشتنمان بۆ ئەو مەبەستە گرێدا، لە ئەنجامدا ڕێکەوتین لەسەر ئەم خاڵانە:

١- لە هەموو ئەو نووسینانەی کە هەبوون لە بەردەستماندا و پەیوەند بوون بە پەیام و پێڕەوی ئیستتیوتی بانگخوازانەوە وەك: پێڕەوی پەسەنکراو و فەرمی ئینستتیوتی بانگخوازان، هێڵە گشتیەکانی دید و کار، کارنامە پێشنیارکراوەکان، پێشنیارەکانی بۆردی راوێژکاری ئینستتوتی بانگخوازان لە دانیشتنی رۆژی(٢٩ی٨ی٢٠١٥ی زایین)، لە هەموو ئەمانە نووسینێك دروست بکەین..

٢- ئەم نووسینە ناوبنێین (پەیام و پێڕەو) و بە یەك کتێب بلاّو بکەینەوە، تا ببێتە پێناسێك و پێڕەوێك بۆ ئینستتوتی بانگخوازان.

٣- ئەم پەیام و پێڕەوە بکەینە چوار تەوەری سەرەکی:

*پەیامی ئینستتیوتی بانگخوازان.

* پێڕەوی ناوخۆی ئینستتیوتی بانگخوازان.

* کارنامەی کەس و دەزگاکانی ناو ئینستتیوتی بانگخوازان.
*بنەما و یاسا گشتیەکان.
٤- ئەم پەیام و پێڕەوە کاری پێ ئەکرێت تا کۆبوونەوەی دەستەی گشتی ئینستتیوتی بانگخوازان، کە مافی گۆڕینی ئەم پەیام و پێڕەوەی پێدراوە لەم پێڕەوەدا.
٥-ئەم پێڕەو و پەیامە دەقی پیرۆز نیە، نەتوانرێت هەموار بکرێتەوە، یان بسڕرێتەوە، بەڵکو ئەمانە هەموو ئیجتیهادی بەشەرین، ئەگەری هەڵە و پەڵەیان هەیە، بۆیە لەم پێڕەوەدا دەسەلاتمان داوە بە ئەنجومەنی بەڕێوەبردن- کە نوێنەری بەشەکانی ئینستتیوتی بانگخوازان و نوێنەری شارەکانی هەموو تێدایە- تا لە کاتی پێویستدا هەمواری ئەم پەیام و پێڕەوە بکات و هاوسەنگ و هارئاهەنگی بکات لەگەڵ شەرع و واقیعدا.
٦-ئەم کتێبە لەبەر ئەوەی لە چوار بەش پێکهاتووە و بەشەکانی کتێبەکەش تێکەڵ بەیەکترین و یەکتری تەواو ئەکەن، بۆیە لە هەندێ شوێندا هەست بە دووبارە بوونەوەی هەندێ برگە و مادە ئەکرێت، ئەوە سروشتی کۆکردنەوەی نووسینەکە لە یەك کتێبدا خواستوویەتی و ئێمەش بۆ زیادە سوود وامان کردووە و نەمانسڕیوەتەوە..
بانگخوازانی بەڕێزی هەرێمی کوردستان!

ئێمە لە ڕێگەی ئەم پێڕەو و پەیامەوە هەمووتان بانگ ئەکەین بۆ ئەوەی تەبەنناى ئەم پەیامە هاوسەنگ و میانڕەوە بکەن و خۆتان بە دوور بگرن لە توندگیری و شلگیری..چونکە وەك شاعیرەکە ئەڵێ:

.............. و كلا طرفي الامر ذميم

بانگتان ئەکەین تا هەموو پێکەوە ئەزموونێکی ئیسلامی تازە -بە بیرێکی هاوسەنگ و میانڕەو-ەوە دروست بکەین، بانگخوازانی کوردستان لەیەکتر نزیك بکەینەوە و ڕوئیایان یەکبخەین و بیانکەینە ناوەندێك بۆ بەرهەمهێنانی بانگخوازی تازە و بە ئەزموون..



**بەشی یەکەم :**

**ماددەی یەکەم: ناو و نیشانەکانی ئینستتیوتی بانگخوازان :**

**١-ناوی ئینستتیوت بەزمانی کوردی: ئینستتیوتی بانگخوازان بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی.**

**٢- ناوی ئینستتیوت بە زمانی عەرەبی : معهد الدعاة للتربية و البحوث العلمية .**

**٤- ناوی ئینستتیوت بە زمانی ئینگلیزی :** The Institute of Preachers for Education and Scientific Research.

**٥- کورتکراوەی ناوەکەی بە ئینگلیزی :** IPESR

**٦- لۆگۆی بانگخوازان:**

**بەشی دووەم :**

**ماددەی دووەم : دید و بۆچوونە گشتیەکانی ئینستتیوتی بانگخوازان :**

**١-ئینستتیوتی بانگخوازان دامەزراوەیەکی بانگەوازیی و پەروەردەیی و رێنمونیکاریی و چاکسازیی سەربەخۆیە.**

**٢- ئینستتیوتی بانگخوازان (ئیسلام)ی کردووەتە چاوگەو پێوەر بۆ بیرکردنەوە و بەرنامەو ئاراستە.**

**٣- ئینستتیوتی بانگخوازان هەوڵ ئەدات کە بانگی مرۆڤەکان بکات بۆ رێزگرتن لە ئیسلام و پابەندبوون بە شەریعەتەکەیەوە..**

٤-ئینستتیوتی بانگخوازان بڕوابوون بە ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەتی کردووەتە ڕوانگە و ڕێڕەو بۆ خۆی.

٥-ئینستتیوتی بانگخوازان نەرمگیری و ئاشتیخوازیی و ئامرازەکانیان دەکاتە هۆکاری گەیاندن و پێگەیاندن.

٦-ئینستتیوتی بانگخوازان بونیادنانی نەوەیەکی نوێ لە بانگخوازانی هەردوو ڕەگەز مەبەستی یەکەم و سەرەکیەتی.

٧- ئینستتیوتی بانگخوازان لە ڕێی نەوەی ئێستا و داهاتووی بانگخوازانەوە دەیەوێت جارێکیتر ئیسلام بناسێنێتەوەو ئیسلامەتیەکی ڕاستەقینەی لێوان لە میهرەبانی و دادخوازیی بە وتارو کردار بخاتە بەرگوێ و بەرچاوی مرۆڤەکان.

٨-ئینستتیوتی بانگخوازان شارەزایی و بەهرەمەندی و دانەبڕان وپاکیی دەکاتە پێوەر بۆ پێگەیاندن و و پێشخستنی بانگخوازان .

٩- ئینستتیوتی بانگخوازان دەیەوێت مامەڵەی لەگەڵ مرۆڤەکاندا گشتگیرانە بێت و وتاری هەبێت بۆ گیان و دڵ و عەقڵ و جەستەی.

١٠- ئینستتیوتی بانگخوازان لە ڕێی ڕاوێژکردن و سەنگینکردن-تەرجیحە-وە هەوڵدەدات گونجاوترین فەتوای خودی پێشەوا شافیعی بکاتە مەزهەبی فیقهی، ئەگەر نا، بە بەراووردی فیقهیی نێوان چوار مەزهەبە سەرەکیەکە بەهێزترین بەڵگەو گونجاوتریتیان لەگەڵ بارودۆخی کۆمەڵگەی کوردەواری هەڵدەبژێرێت، بۆ ئەم مەبەستەش پەنا دەبات بۆ شارەزایان و زانایان.

١١- ئینســـتیوتی بـــانگخوازان بـــڕوای وایـــە کـــە کـــات و شـــوێن و زەیـــنی کوردستانیەکان تایبەتمەندی خۆی هەیەو بە پێویستی دەزانێت لە ئـان و سـاتی بانگەواز و دابەزاندنی ئیجتیهادە بانگەوازییەکانـدا ڕەچـاوی زمـان و کـەلتور و بەرژەوەندی گشتیان بکرێت.

١٢-ئینســـتیوتی بـــانگخوازان پێـــوەری وەرگـــرتن و ڕەتکردنـــەوەی شـــتەکانی کۆکردوەتەوە لـە وەحیـی-قورئـان و سـوننەت- و عـەقڵی ئیجتیهـادیی و ئـەو ئەزموونـە جوانـە مرۆییانـەی دژ ناوەسـتنەوە لـە ڕووی وەحیـی و ژینگـەی کۆمەڵایەتی و کلتور و نەریتی بەرز و بەرژەوەندی گشتی گەلەکەماندا .

١٣- ئینستتیوتی بانگخوازان خیتابی (ئیسلام)یانەی لەسـەر ڕەگ و ڕایەڵـەی (هاوسەنگ)ی پەخش دەکات .

١٤-ئینستتیوتی بانگخوازان دژی پەرگیری و کەمگیری بۆ ئیسلام دەوەستێتەوە و هەوڵدەدات سنوردار و ریشەکێشی بکات چ لە فیکـردا بێـت یـان لـە کـردار و ڕەوشت دا بێت .

١٥- لە فیکری ئینستتیوتی بانگخوازاندا سەرچاوەکانی ئیسـلام بـە ریزبەنـدی بـریتین لـە قورئـانی پـیرۆز و سـوننەتی باڵـا و ئیجمـاعی هاوەڵـان و عـەقڵی ئیجتهادیی، مەرجەعییەت و بریاری کۆتـاییش تـەنیا بـۆ خـودا و پێغەمبـەری خودایە -سەڵات و سەلامی خودای لەسەر بێت- لە هەموو کاتێکـدا بەتایبـەتی لە کاتی ناکۆکیەکاندا .

١٦- سەرەرای بە پێوەرگرتن و ملکەچبوون بۆ سەرچاوە سەرەکیەکانی شەریعەت کە قورئان و سوننەت و ئیجماع و قیاسە، تەواوی سەرچاوە ئوسولّیەکانیتری حوکمەکان وەکو ئیستیحسان و مەسلّەحەی مورسەلە و عورف و مەزهەبی سەحابی و شەرعو مەن قەبلەنا و زەریعە جێی بڕوای ئینستتیوتی بانگخوازان دەبێت و پشتیان پێ دەبەستێت لە بزاڤی ئیجتیهادی بانگەوازییدا.
١٧- ئینستتیوتی بانگخوازان قوتابخانەیەکی ئیسلامخوازی نەرم تەبیعەت و فیکر فراوان و سینە کراوەیە و بە یەك دووریی دەروانێتە کەس و لایەن و قوتابخانە فیقهی و فیکری و سلوکی و بزاڤە ئیسلامیەکان و سوود لە هەموویان دەبینێت و سوود بە هەموویان دەگەیەنێت. هەر بۆیە دەیەوێت هەموو بانگخوازێکی موسلّمان بێ خوێندنەوەی رەوتەکەی رێزلێگیراو بێت و شوێنی شیاوی خۆی پێبدرێت.
١٨- ئینستتیوتی بانگخوازان بڕوادارە بەوەی کە ئیسلام بە رەنجی بەردەوامی پیاوان و ئافرەتان گەیشتووەتە ئەمڕۆ، بۆیە دەیەوێت ئەمڕۆش ئافرەتان بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەلّبسن لە زیندووراگرتنی کار و کاریگەری ئیسلام و بەرە و پێش بردنی ئیسلامەتی کۆمەلّگەی موسلّمان بۆ گەیشتن بە ئامانجە بالّاکان .
١٩-ئینستتیوتی بانگخوازان بۆ گەیشتن بە ئیجتیهادی بزاڤیی و سلوکیی و تازەگەری و فەتوای بوارە بانگەوازییەکان گوێ لە فەقیهو و خەبیرە کوردستانیەکان دەگرێت و خوێندنەوە و گواستنەوەی بۆ ئەزموونە بانگەوازییەکانی گەلانیتر بە هەند وەردەگرێت .

٢٠-ئینستتیوتی بانگخوازان بڕوای وایە کە مەجمەعێکی فیقهی بووەتە پێویستیەکی ئەم قۆناغە، بڕواشی هەیە کە هەر کەسێکی بانگخواز ئەگەر نەگەیشتبێتە پلەی ئیجتیهاد و نەزەردان لەسەرێتی شوێنکەوتەی مەزهەبی پێشەوا شافیعی یان یەکێك لە مەزهەبە فیقهیەکانی ئومەتی سوننەت و جەماعەت بێت، بەڵام ئەو بانگخوازەی خولیای زانستیی هەیە و مادامێك لە بەڵگەکان تێدەگات ئەرکی سەرشانیەتی داوای بەڵگە بۆ فەتواکانی موفتی و پێشەوا فیقهیەکەی بکات، ئەگەریش توانای ئەوەی هەبوو هەڵسەنگاندن بۆ مانا و مەبەستی بەڵگەکان بکات و بەراووردی قوڵیان لێ دەرك و دەربێنێت ئەوە پێویستە کەمتەرخەمی نەکات و لە ڕووی بە سەنگین کردنە-تەرجیح-وە لایەکی بەڵگەکان هەڵسەنگێنێت و بیکاتە جێ بڕوای فیقهی خۆی.

٢١- ئینستتیوتی بانگخوازان بنچینەکانی ئیمان و پایەکانی ئیسلام و دیاردەکانی ئیحسان و یاسا و ڕێساکانی شەریعەت و بنەما بانگەوازییەکان و خزمەتە بانگخوازییەکان دەکاتە پێگەی کۆکردنەوەی بانگخوازان و کەرەسەی گرێدانی توانا و پرۆژە و پێشنیار و پێشبینیەکانیان.. خاڵ و خەتە کۆکەرەوەکان هەمیشە بنەڕەتی کاری ئینستتیوت دەبێت و خاڵی جیاواز و جیاکەرەوەش ڕێکدەخات یان لێیان بێدەنگ دەبێت و دەستی بۆ نابات تا کاتی گونجاو دێت بۆ چارەسەر کردنی.

**بەشی سێیەم :**

**ماددەی سێیەم : ڕێگەی ئینستتیوتی بانگخوازان :**

ئینستتیوتی بانگخوازان دەیەوێت وەك دامەزراوەیەكی خۆبەخشی سەربەخۆی ناحكومی و پابەند بە بەرژەوەندیە گشتیەكانەوە هاوكارێكی ڕاستەقینەی هەموو لایەك بێت لە ڕێخۆشكردن و دەست گرتنی بانگخوازان بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانیان لە ڕێگەی ئامرازە زانستی و توانا مرۆیی و پرۆژە هاوچەرخیەكانەوە، تا بانگخوازان ببنە تاك و تاقمێكی سوودبەخش بۆ كۆمەڵگەی كوردەواری و مرۆڤایەتی بە گشتی و ڕۆڵی گەورەشیان هەبێت لە گۆڕینی شێوازە لاواز و بێ كەڵكەكانی بانگەوازدا، هەروەها ئینستتیوت پاڵپشت دەبێت بۆ مافەكانی سەرجەم ئایین و ئایینزاكان لە كوردستان، بە هیچ شێوەكیش نابێتە بەشێك لە پرۆژەی سیاسی و ستراتیجی هیچ حیزب و دەسەڵاتێك، بەڵام پشتیوان دەبێت بۆ پرۆژە و پێشنیارێك ئەگەر دڵنیابوو خزمەت دەكات بە بانگەوازی ئیسلام و ئامانجە باڵاكانی خەڵك و كۆمەڵگەی موسڵمانی كوردستان.

## بەشی چوارەم

**ماددەی چوارەم : ئامانجەکانی ئینستتیوتی بانگخوازان :**

**١-بەرزکردنـــەوەی ئاســـتی زانســـتی و فیکریـــی و رۆشـــنبیری بـــانگخوازان و ڕێگاکردنەوە بۆ هاتنە پێشەوەی نەوەیەکی نوێی بـانگخوازان کـە بتـوانن ببنـە زەمانەتی بەردەوامی بانگەوازی ئیسلام.**

**٢-ئاراســتەکردنی بـــانگخوازان بـــۆ ڕێبـــازی نـــەرمگیریی و لەســـەرخۆیی لـــە بانگەوازدا و یەکتر قبولکردن و گەڕانەوە بـۆ پێـوەرە زانسـتی و بنـەما گشـتیە کۆکەرەوەکان لە کاتی بوونی جیاوازیی و ناکۆکیەکاندا.**

**٣-یارمەتیـدانی خۆبەخشـانەی دەزگـا حکـومی و ناحکومیـەکان بـە پـرۆژە و پێشنیاری زانستی و پەروەردەیی و رۆشنبیری..**

**٤-برەودان بە کاروباری خۆبەخشـانەو خێرخـوازیی و کۆششـی مـەدەنی و ئـایین پەروەریی و ڕەوشت پارێزیی و پارێزگاری لە بەرژەوەندی گشتی .**

**٥-هۆشیارکردنەوە و داوای قەدەغەکردنی هەر کەلتور و ڕەفتارێـك کـە هـاوردە کرا بێت و دژایەتی وەحیی یان نەریتی جوانی میللەت و ئادابی گشتی بکات .**

**٦-هەوڵـدان بـۆ قوڵکردنـەوەی ئاشـتی کۆمەڵایـەتی و خۆشـکردنی ژینگـەی ئاشتەوایی نێـوان تـاك و خێـزان و جومگـە گشـتی و تایبـەکانی کۆمەڵگـەی کوردەواری.**

**٧-کۆکردنەوە و یەکڕیزکردنی بـانگخوازانی ئیسـلام بـە بـێ هەسـتیاریی لـە ئینتیمای سیاسی و ناوچەیی، گەشە پێدانی تواناکانیـان و گرنگـی پێـدانیان.**

ئینستتیوت -بڕوای هەیە و کردوێتی بە ئەرکی خۆی- بە گردکرنەوەی بانگخوازە هەمە ڕەنگ و هەمە ئینتیماکان بە ئامانجی یەك دڵ و یەك دەنگ کردنیان .

٨-گرێدانی پەیوەندی و هەماهەنگی و هاوپرۆژەیی لەگەڵ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکان و پیادەکردنی بیر و بروا بنچینەییەکانی ئینستتیوت. هەروەها هەڵگرتنی هەر هەنگاوێکی دوولایەنە کە خزمەت بکات بە کاری مرۆڤدۆستی و تۆخکردنەوەی ئینتیمای خەڵك بۆ ئایین و مێژوو کەلتوورو زمان و تۆکمەکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە بونیادنەرەکان بە گشتی .

٩- کۆشش کردن بۆ نەوەی تاك و خێزان و کۆمەڵگەو کەسایەتی کوردیی متمانە بە خۆیان بکاتەوەو بەهیواوە بروانە داهاتووی خۆیان و لە دەروازەی ئیسلامەتیەکی ژیرانەی میهرەبانانەوەبگەڕێن بە شوێن گەنجینەی ئاسودەیی دڵان و ئاوەدانکردنەوەی نیشتمان.

١٠-گرنگیدان بە ڕۆڵی بانگەواز لە ژیانی ژنان و کچان و تەربیکردنی بانگخواز و بانگخوازییان لەگەڵ بانگەوازی پیاوان و کوڕاندا لە هەر بوارێکدا پێویست بکات و لە توانای ئینستتیوتدا بێت .

بەشی پێنجەم :

ماددەی پێنجەم : ئامرازو میکانیزمی کاری بانگەواز :

١-کردنەوەی خول و راهێنان و وانەی زانستی و هاوچەرخ.

٢- نوسین و چاپکردن و بڵاوکردنـەوەی کتێـب و نامیلکـە و گۆڤـاری کاغـەز و ئەلەکترۆنی و دیواربەند(جداری).

٣- وەرگێڕان لە زمانەکانیتر بۆ کوردی و بە پێچەوانەوەو هێنان و ناردنی کـەس و ئینستتیوتە تایبەتمەندو پسپۆرییەکانی دەرەوەی کوردستان .

٤- کردنەوەی خوێندگە و پەیمانگا و کۆلێژی ئەهلی.

٥- فێربوون و فێرکردنی زمانە زیندووەکانی ناوچەکە و جیهان بـۆ گەیانـدن و ئاڵ و گۆڕکردنی ئەزمونە بانگەوازیەکان لەهەردوو بواری تیۆریی و کردەییدا .

٦- سازدانی کۆڕ و وۆرکشۆپ و کۆنگرە و کۆنفراس بـۆ هـەر بابـەت و باسـێکی نویێ و پێویست.

٧- دانان و بەکارهێنان کەناڵی تەلەفزیۆنی پسپۆری و رادیۆ و تۆری ئینتەرنێت و هەر ئامرازێکیتر.

٨- توێژینەوەی زانستی و راپرسی سەربەخۆ یان هاوبەش لەگەڵ دەزگاکانیتر.

٩- کردنەوەی خێوەتگە و وەرزی رۆشنبیری لە ناوچە و شارەکانی کوردستان.

١٠-هەر ئامرازو شێوازێك و بازنـەکارێکی مـەدەنی و هێمانانـە کـە خزمـەت بکات بە ئامانجەکانی بانگەواز و بانگخوازان.

١١-بەشداریکردن بە بانگخوازان لـەو خـول و خێوەتگەیانـەی کـە لـە دەرەوەی کوردستان سازئەکرێن.

**بەشی شەشەم :**

**ماددەی شەشەم : بنچینەکانی ئەندامێتی و کاری بانگخوازیی لـە ئینسـتتیوتی بانگخوازاندا :**

**١-مەرجەکانی ئەندامێتی لە هەموو جومگەکانی ئینستتیوتدا :**

**یەك : هیچ کـارێکی پێچـەوانە بـە پـەیام و پێـرەوی ئینسـتتیوت نـەکات بـە راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ . هەروەها رێزو رەچاوی پەیام و پێـرەوی ئینسـتتیوت بکات و بڕوادار بێت پێیان و لە ژیانی تایبەت و گشتیدا جێبە جێیان بکات .**

**دوو : تەمەنی بگاتە هەژدە ساڵ.**

**سێ : بەخشینی مانگانەی دیاری کراوی هەبێت بە پێی توانا .**

**٢-لە دەستدانی ئەندامێتی (سەرپێچی و سزاکان)**

**ئەلف : سەرپێچیەکان :**

**یەك : پاپەند نەبوون بە پەیام و پێرەوی ئینستتیوتی بانگخوازانەوە.**

**دوو : سێ جار لەسەر یەك ئامادە نەبوون لە کۆبوونەوەکان بێ پرس و بێ پاساو.**

**سێ : ئەگەر لە دوای شەش مانگ لە بە ئەندام بوون دەرکەوت کە نایەوێت یـان ناتوانێت هیچ چالاکی و بەشداریەکی هەبێت .**

**بێ : سزاکان:**

**یەك : ئاگادارکردنەوە.**

دوو : سەرنج راکێشان.

سێ : سڕکردنی ئەندامێتی.

چوار : لێسەندنەوەی ئەندامێتی.

٣-: مافەکانی ئەندام :

یەك : مافی سودوەرگرتنی هەیە لە خزمەتگوزاریەکانی ئینستتیوت بە ئەندازەی چالاکی و سنوری بەخشینی تواناکانی بۆ ئامانجەکانی ئینستتیوت .

دوو : مافی پێشنیارکردن و ئامۆژگاری و رەخنەگرتنی هەیە .

سێ : رێز لە خولیا و ئارەزووە شەخسیەکانی ئەندامان دەگیرێت و گەشەی پێیدەرێت ئەگەر خزمەتی بە بەرژەوەندی گشتی ئینستتیوت بکات .

چوار: مافی دەنگدان و خۆپاڵاتنی هەیە، هەروەها مافی ئەوەشی هەیە دەست لە کار بکێشێتەوە لە پایەیەکی ئینستتیوت یان بە یەکجاری لە کارکردن لەنێو ئینستتیوت بکشێتەوە .

پێنج : مافی چاودێریی و وەرگرتنی زانیاری و خوێندنەوەی ئەرشیفی ئینستتیوتی هەیە بە مەبەستی توێژینەوە.

شەش : هەموو ئەندامان مافی مەعنەریان هەیە لە بەکارهێنانی کەرەستە و کەل و پەلی ئینستتیوتدا، بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئینستتیوتی بانگخوازان .

٤- ئەرکەکانی ئەندام :

یەك : كار لە پێناو گەشەپێدانی بانگەواز و كاری خۆبەخشی لەو پێناوەدا بكات . بۆ ئەو مەبەستەش پێویستە كـات و تەمـەنی پێویسـت تـەرخات بكـات بـۆ بانگەواز و كاری خۆبەخشیی .

دوو : پەرە بدات بە چەمك و كردەی كاری گشـتی و نـاوو ناوبـانگی بانگـەواز و ئینستتیوت بۆ بەرژەوەندی كەسیی بەكار نەهێنێت .

سـێ : بەشـێكی پێویسـت لـە كـار و چـالاكیەكانی بـەناوی ئینسـتتیوتی بانگخوازانەوە ئەنجام بدات.

چوار : ئینستتیوتی بانگخوازان بپارێزێت لەوەی بكەوێتە ژێر فشاری لایەنـەكان و رێگە نەدات بە هیچ شێوەیەك سەربەخۆیی بڕیارەكـانی ئینسـتتیوت لەكـەدار ببێت .

پێـنج : پاپەنـدبوونی فیكـری و فیعلیـی بـە پـەیام و پێـڕەوی ئینسـتتیوتی بانگخوازانەوە .

**بەشی حەوتەم :**

**ماددەی حەوتەم : مەرجەکانی ئەندامێتی لە بۆردی راوێژکاری و سەرپێچی و سزاکان.**

**١-مەرجەکانی بوونە ئەندام لە بۆردی راوێژکاریدا :**

یەك:هیچ کارێکی پێچەوانە بە پەیام و پێرەوی ئینستتیوت نەکات بە راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ .

دوو : تەمەنی لە ٣٠ ساڵ کەمتر نەبێت .

سێ : بەخشینی مانگانەی دیاریکراوی هەبێت .

چوار: جگە لە زمانی کوردی دەبێت زمانی عەرەبی یان زمانی ئینگلیزی یان هەر زمانێکی زیندووی جیهانی بزانێت و شارەزایی یان بروانامەیەکی بالای بوارێکی فیقهی یان فیکریی یان زانستێکی مرۆڤایەتی یان زانستێکی گەردوونی هەبێت .

پێنج : ئەندامان و ژمارەی ئەندامان لە لایەن ئەنجومەنی بەڕێوەبردنەوە دیاری دەکرێت.

شەش: هەوڵی پێویست خەرج بکات بۆ ئەوەی ئینستتیوت سەرچاوەی دارایی سەقامگیری هەبێت و یارمەتیدەری کردەیی بێت بە پرۆژە بۆ پێگەیاندنی نەوەی نوێی بانگخوازیی.

**٢-لە دەستدانی ئەندامێتی لە بۆردی راوێژکاریدا:**

ئەلف :سەرپێچیەکان :

یەك : پاپەندنەبوون بە پەیام و پێرەوی ئینستتیوتی بانگخوازانەوە.

دوو : ئامادەنەبوونی سێ جار یەك لە دوای یەك لەکۆبوونەوەکان بێ پرس و بێ پاساو.

بێ : سزاکان:

یەك : ئاگادارکردنەوە..

دوو: سەنجراکێشان.

سێ:سڕکردنی ئەندامێتی.

چوار: لێسەندنەوەی ئەندامێتی .

٣- ماف و ئەرکەکانی ئەندامانی بۆردی راوێژکاری :

بۆردی راوێژکاری: پێکدێت لە کەسە شارەزا و پسپۆڕەکان لە بواری زانستی و پەروەردەیی و بانگخوازیدا، ژمارەیان لە لایەن ئەنجومەنی بەڕێوەبردنەوە دیاری ئەکرێت.

یەکەم : مافەکانی بۆردی راوێژکاری :

١-بڕیاردەری بۆردی راوێژکاری لە رێگەی هەڵبژاردنی نهێنیەوە دیاری دەکرێت و بە زۆرینەی دەنگی (٥٠+١)ی ئامادەبووان دەبێت .

٢- بڕیاردەری بۆردی راوێژکاری ئەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی ئیستتیوتی بانگخوازان.

٣-مافی بەشداریکردنیان هەیە لە چالاکیەکانی سنووری نووسینگەکاندا..

٤-شەش مانگ جارێك كۆبوونەوەی ئاسایی خۆیان ئەبێت و بۆ کاری پێویستیش كۆبوونەوەی نائاسایی ئەکات.

٥-ئەندامی بۆردی راوێژکاری بە پێی مەرجەکان دەتوانێت خۆی بپالێوێت بۆ جومگەکانی ئینستتیوتی بانگخوزان.

ئەرکەکان : : دووەم

١-سەربەخۆیی ئینستتیوت بپارێزێت لە هەموو ئاراستەیەکی دژە ئیسلام و پێچەوانە بە رێرەو و رێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت .

٢-کار لە پێناو گەشەپێدانی بانگەواز و کاری خۆبەخشی لەو پێناوەدا بکات

٣-پەرە بدات بەچەمك و کاری گشتی و ناو وناوبانگی بانگەواز و ئینستتیوت بۆ بەرژەوەندی کەسیی بەکارنەهێنێت.

٤-ئینستتیوتی بانگخوازان و بۆردی راوێژکاری بپارێزێت لەوەی بکەوێتە ژێر فشاری لایەنەکان، ئەرکی سەرشانیەتی سەربەخۆیی ئینستتیوتی بانگخوازان بپارێزێت.

٥-پابەندبوونی فیکری و فیعلیی بە پەیام و پێرەوی ئینستتیوتی بانگخوازانەوە هەبێت.

٦-بۆردی راوێژکاری سەرچاوەی راوێژی ئەنجومەنی بەرێوەبردنن لە بابەتە چارەنوسسازەکان و ئەو بابەتە فیکری و فیقهی و ئیدارییانەی کە ئەنجومەنی بەرێوەبردن ناتوانێت چارەسەریان بکات . بریارەکانیشیان بۆ پابەندکردنی

ئەنجومەنی بەڕێوەبردن پێویستە بە دەنگی (٥٠+١)ی ئامادەبووانی کۆبوونەوەی بۆردی راوێژکاران بێت. ئەمەش کاتێك دەبێت کە ئەنجومەنی بەڕێوەبردن بە رەسمی داوای بڕیاری پێویست بکات لە بۆردەکە بۆ چارەسەری بابەتێکی دیاریکراو.

٧-پێشنیارکردن و دانانی نەخشەی ساڵانە بۆ ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی بانگخوازان.

٨-ئەندامانی بۆرد بە پرۆژە و پێشنیار راستەوخۆ ئەتوانن هاوکاری ئەنجومەنی بەڕێوەبردن بکەن.

بەشی هەشتەم :

ماددەی هەشتەم : پەیکەری ئیداری ئینستتیوتی بانگخوازان:

یەکەم : ریزبەندی پێکهاتەی ئینستتیوتی بانگخوازان بەم شێوەی خوارەوەیە:

١-دەستەی گشتی.

٢-بۆردی راوێژکاری.

٣-ئەنجومەنی بەڕێوەبردن.

٤-دەستەی کارگێڕی.

٥-نووسینگە و لقەکان.

دووەم : دەستەی گشتی و ماف و ئەرکەکانی :

١-دەستەی گشتی: بەرزترین دەسەلاتە ، پێکدێت لە ئەندامانی بۆردی راوێژکاری و ئەنجومەنی بەڕێوەبردن و و ئەنجومەنی نووسینگەکان و ئەنجومەنی لقەکان و ئەندامانی بەشەکانی ئیستتیوتی بانگخوازان..

٢-پێنج ساڵ جارێك هەڵبژاردن دەکات بۆ دیاری کردنی سەرپەرشتیاری گشتی و یاریدەدەرەکانی و ئەندامانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن.

٣-بە پێی مەرجەکان هەموو ئەندامێك دەتوانێت خۆی بپاڵێوێت بۆ هەر پایەیەك لە ناو تەواوی جومگەکانی ئینستتیوتی بانگخوازاندا.

٤-هەموو ئەندامێکی ئینستتیوت دوای پەککەوتنی لە کاری بانگخوازیی جا بە هۆی نەخۆشیی یان پیریی یان بە هۆی دەرنەچوونەوەی لە هەڵبژاردنەکاندا هەموو مافێکی مەعنەوی بەسەر ئینستتیوتەوە دەمێنێت و رێز و کەرامەتی زانستی و ئیمانیی پارێزراو دەبێت بە پێی تواناش پشتگیری ماددی دەکرێت ئەگەر پێویستی بوو.

سێیەم : ئەرك و مافەکانی ئەنجومەنی بەرێوەبردن :

یەکەم :ئەرکەکانی ئەنجومەنی بەرێوەبردن :

ئەنجومەنی بەرێوەبردن : پێکدێت لە سەرپەرشتیاری گشتی ئیستتیوتی بانگخوازان و یاریدەدەرەکانی و بەرپرسە کارگێڕییەکان و بەرپرسی نوسینگەکان.

ئەرك و مافەکان:

١-مانگی جارێك کۆبوونەوەی ئاسایی دەکات .

٢-كۆبوونەوەكان لەلایەن سەرپەرشتیاری گشتی ئینستتیوتەوە بەرێوەدەبرێت، یان لە لایەن یەكێك لە یاریدەدەرەكانیەوە.

٣-بە دەنگی زۆرینەی سادە بریارەكان یەكلا دەكرێتەوە .

٤- ئامادەكردن و پەسەندكردنی پرۆژەكان و سپاردنی بە دەستەی كارگێری بۆ جێ بە جێكردنی .

٥-هەڵسەنگاندن و بریاردان لەسەر پرۆژە و بەرهەمەكانی نوسینگە و لقەكان .

٦-پێداچوونەوە و گۆرانكاری پێویست بۆ پێشنیارەكانی دەستەی كارگێڕی و بۆردی راوێژكاری و دیاری كردنی لیژنە و نوێنەر بۆ بەدواداچوون و بەگەرخستنیان.

٧-پەسەندكردنی بودجەی ساڵانە و بەدواداچوون بۆ داهات و خەرجیەكان.

٨- پەیداكردنی سەرچاوەی دارایی بە هاندان و یارمەتی هەموو جومگە ئیداریەكانی ئینستتیوت و كەسەكان .

٩-هێڵە گشتیەكانی كاری بانگخوازیی دیاریدەكات..

١٠-بڕیار ئەدات لەسەر كردنەوەی نووسینگە و لقەكان.

١١-پێش كۆبوونەوەی دەستەی گشتی بەرنامە دائەنێت بۆ هەڵبژاردنی بەرپرسی نووسینگەكان و بەرپرسی لقەكان بە زۆرینەی دەنگ.

١٢-بڕیار ئەدات لەسەر كردنەوەی نووسینگەی نوێ.

١٣-بڕیار ئەدات لەسەر ئەنجامدانی كۆبوونەوەی گشتی و خول و راهێنانە مەركەزییەكان.

١٤-وەرگرتنی ئەندامی تازە بــە زۆرینــەی دەنــگ و لێســەندنەوەی متمانــە لــە ئەندامان بە ٢/٣ی دەنگ.

١٥-هەمواركردنی پەیام و پێڕەو و كارنامەكان  بە زۆرینەی دەنگ.

چوارەم : بۆردی راوێژكاری ئەرك و مافەكانی .

لە بەشی حەوتەم و ماددەی حەوتەم و بڕگەكانیدا باسكراوە.

پێنجەم : دەستەی كارگێری و ئەرك و مافەكانی :

یەكەم : دەستەی كارگێری پێكدێت لە :

١-سەرپەرشتیاری گشتی ئینستتیوتی بانگخوازان .

٢-یاریدەدەرەكانی ئینستتیوتی بانگخوازان

٣-هەموو بەرپرسە كارگێریەكان كە بریتین لە : بەرپرسی كارگێری + بەرپرسـی دارایی + بەرپرســی پرۆژەكــان و پــەروەردەی هاوچــەرخ + بەرپرســی گفتوگــۆ و پەیوەندیە گشتیەكان + بەرپرسی ئیرشاد و راگەیاندن + بەرپرســی توێژینــەوە و تازەگەری + بەرپرسی گرۆپی دیدات+بەرپرسی كاروباری گەنجانی بانگخواز.

٤-دوو هەفتە جارێك یەك  كۆبوونەوەی ئاسایی دەكات.

دووەم : ئەرك و مافەكانی دەستەی كارگێری :

١-مافی پێشنیاركردنی كردنەوەی نووسینگە و لقی تازەی هەیە.

٢- مافی دروستكردنی لیژنەی جۆراوجۆری هەیە بۆ راپەڕاندنی كار و چـالاكی و پرۆژە بانگخوازیەكان.

٣-سەرپەرشتی بەشەکان و نوسینگەکان ئەکات و رێنمایی پێویستیان بۆ دەردەکات..

٧- لەسەر کات و شوێنی کۆبوونەوەکان و کۆبوونەوەی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن بریار دەدات .

٨- ئامادەکردنی رەشنووسی پلانی سالآنە بۆ ئەنجومەنی بەڕێوەبردن.

٩- چاودێری جێبەجێکردنی بڕیار و پرۆژەکان ئەکات.

سێیەم : نوسینگەو لقەکان: ئەرك و مافەکانی نووسینگەکان:

١- لەسەر ئاستی پارێزگا و ئیدارە گشتی و شارە گەورەکان نوسینگە دادەمەزرێت.

٢- لەسەر ئاستی قەزاکان لق دادەمەزرێت .

٣- کەسی یەکەمی نوسینگە و لقەکان بە بەرپرس وەسف دەکرێت .

٤- بەرپرسی نوسینگە ئەندامی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن دەبێت و هەموو ماف و ئەرك و ئیمتیازێکی وەك ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەن پارێزراوە .

٥- بەرپرسی لقەکان دەبنە ئەندامی ئەنجومەنی نوسینگە و هەموو ماف و ئەرکێکی وەك ئەندامی هەمیشەیی نوسینگە پارێزراوە.

٦- هەر بەشێکی کارگێری لە دەستەی کارگێری هەبێت لە نوسینگەو لقەکان دووبارە دەبنەوە بە پێ پێویستی .

٧- بەرپرسی نوسینگە یاریدەدەری ئەبێت و لە لایەن ئەنجومەنی نووسینگەوە هەڵدەبژێررێت.

٨- نوسینگەو لقەکان لە سنوری جۆگرافیای خۆیاندا بەرپرسن لە کاروباری بانگەوازو بانگخوازان و لەسەریانە خاوەنی پرۆژە و چالاکی خۆیان بن بە پێی ئامانج و ئامرازەکانی ئینستتیوتی بانگخوازان.

٩-نوسینگەو لقەکان لە سنوری دەسەڵاتی خۆیاندا بە مەبەستی یەکخستنی تواناکان و نزیك بوونەوە لە ئامانجەکان بۆیان هەیە پرۆژەی هاوبەش و چالاکی هاوبەش لەگەڵ رێکخراوەکانیتردا ئەنجام بدات.

١٠-بە هەوڵ و بەرنامەی هاوتەریبانە و بە پێی ئامانج و ئامرازەکانی ئینستتیوت نوسینگەو لقەکان لەسەریانە گەشە بدەن بە بانگەوازی ئیسلام و پێگەیاندنی بانگخواز لە ناو هەردوو رەگەزی نێرینە و مێینەدا بە بێ جیاوازیی.

١١- گرنگیدان بە هەموو بانگخوازانی ئیسلام لە هەر دوو رەگەز، بە بێ گوێدانە هیچ جۆرە ئینتیمایەك، و کارکردن بۆ گەشەدان بە بەهرەکانی بۆ بەرژەوەندی گشتی بانگەوازی ئیسلام و کۆمەڵگە.

١٢-نوسینگە و لقەکان مانگی جارێك کۆبوونەوەی ئاسایی دەکەن.

**شەشەم : ئەرك و مافەكانی سەرپەرشتی گشتی ئینستتیوتی بانگخوازان:**

١- ئیمزا لەسەر نوسراوە فەرمیەكان دەكات.

٢- لێپرسینەوە لە دەستەی كارگێری و ئەنجومەنی بەرێوەبردن دەكات و مافی سەرزەنشت و پاداشتی ئەندامانی هەیە.

٣- نوێنەرایەتی ئینستتیوتی بانگخوازان دەكات لە هەموو كۆبوونەوە كوردستانی و نێودەوڵەتیەكاندا.

٤- ئیمزا لەسەر رێكەوتن نامەكان دەكات لەگەڵ ئینستتیوتە ناوخۆیی و دەرەكیەكاندا .

٥- ووردبینی و بەدواداچوون بۆ داواكاری و پێشنیارو پرۆژەو سكالاكان دەكات و دەیخاتە بەردەم ئەنجومەنی بەرێوەبردن و دەستەی كارگێری هەریەكەو بە پێی دەسەڵاتی خۆیان.

٦- پێویستە هەندێك لە دەسەڵاتە دارایی و ئیدارییەكانی بسپێرێت بە یاریدەدەرەكانی.

٧- سەرپەرشتی كۆبوونەوەكانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن و دەستەی كارگێڕی ئەكات.

٨- بانگهێشت بۆ كۆبوونەوەی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن و دەستەی كارگێڕی ئەكات.

٩- رەزامەندی لەسەر خەرجی پرۆژەكان ئەدات.

١٠- ئـەركی سـەرەكی پاراسـتنی یـەكریزی و سـەربەخۆیی ئینسـتتیوتی بانگخوازانە.

١١- راپۆرتی سالآنە ئامادە دەكات.

١٢- لە كاتی ئامادەنەبوونیدا یـەكێك لـە یاریـدەدەرەكانی رادەسـپێرێت بـۆ ئەنجامدانی ئەركەكانی.

حەوتەم : ماف و ئەركـەكانی یاریـدەدەرانی سەرپەرشـتی گشـتی ئینسـتتیوتی بانگخوازان :

لە سنووری ئەو دەسەلآتە ئیداریی و داراییانەی لە لایەن سەرپەرشتیاری گشـتی ئینستتیوتی بانگخوازانەوە پێیان ئەدرێت ئەرك و مافەكانیان پارێزراوە.

بەشی نۆیەم :

ماددەی نۆیەم : سەرچاوەكانی داهات و دارایی ئینستتیوتی بانگخوازان :

١-بەخشین و دیاریی و زەكات و وەقفی ئەندامان و پشتیوانان و خێرخوازان .

٢-هاوكاری تایبەتی حكومەت بۆ ئینستتیوتەكان .

٣-داهات و قازانجی چالاكی و پرۆژەكان..

٤-بەشداری دارایی مانگانەی ئەندامان..

٥-هەموو هاوكاری و یارمەتیەكی بیّ مەرج.

**بەشی دەیەم :**

**ماددەی دەیەم : تۆمارەکانی ئینستتیوتی بانگخوازان بەم شێوە دەبێت :**

**١- تۆماری ئەندامان**

**٢- تۆماری ژمێریاری**

**٣- تۆماری سامان و وەقفی گواستە و نەگواستە .**

**٤- تۆماری بریارەکان و کۆنوسەکان .**

**٥- هەر تۆمارێکی تر..**

## بەشی یازدەیەم

**کارنامەی بەشەکانی ئینستتیوتی بانگخوازان:**

**بەشەکانی ئینستتیوتی بانگخوازان بریتیین لەمانەی خوارەوە:**

**یەکەم: بەشی دارایی**

**دووەم: بەشی بەڕێوەبردن**

**سێیەم: بەشی ئیرشاد و راگەیاندن**

**چوارەم: بەشی گفتوگۆ و پەیوەندیە گشتیەکان.**

**پێنجەم: بەشی پرۆژەکان و پەروەردەی هاوچەرخ**

**شەشەم: بەشی توێژینەوە و تازەگەری**

**حەوتەم: بەشی کاروباری گەنجانی بانگخواز**

**هەشتەم: بەشی گروپی دیدات.**

یەکەم : سەرپەرشتیاری گشتی

سەرەڕای دەسەڵاتەکانی لە پەیڕەوی ناوخۆدا ئەم دەسەڵاتانەشی هەیە:

ئەرك و مافەکان:

١. سەرپەرشتی دەستەی کارگێڕی و ئەنجومەنی بەڕێوەبردن دەکات.
٢. ڕێنمایی و بیرۆکەی نوێ دەداتە دەستەی کارگێڕی بۆ بەرەوپێشبردنی کار و پرۆژەکان .
٣. بانگهێشت بۆ کۆبونەوەی نائاسایی دەستەی کارگێڕی و ئەنجومەنی بەڕێوەبردن دەکات .
٤. بەدواداچوون بۆ بڕیارەکانی دەستەی کارگێڕی دەکات و لێپێچینەوە لە کەسی کەمتەرخەم دەکات و کەسی کارا و چالاك پاداشت دەکات.
٥. ڕەزامەندی لەسەر خەرجی پرۆژەکان دەدات.
٦. لە کاتی ئامادەنەبونیدا، یان لە کاتی خاڵیبوونەوە-شاغر-بوونی شوێنەکەیدا بە تەمەنترین یاریدەدەری بە کارەکانی هەڵدەستێت.
٧. ناساندنی ئینستتیوت بە ناوەندە پەیوەندیدارەکان .
٨. هەوڵی پەیداکردنی کۆمەکی دەدات بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکانی ئینستتیوت.
٩. پاراستنی یەکریزی و سەربەخۆیی ئینستتیوت.
١٠.ئامادەکردنی ڕاپۆرتی ساڵانە.

دووەم : یاریدەدەری سەرپەرشتیاری گشتی

ئەرك و مافەكان :

١- لە كاتی ئامادەنەبوونی سەرپەرشتیاری گشتیدا، یان لەسەركارلاچوونی بەتەمەنترینیان بەشێوەیەكی كاتی كارەكانی ئەنجام دەدات.

٢- هەر كارێك كە سەرپەرشتیاری گشتی بە فەرمی پێی دەسپێرێت.

٣-لە لایەن ئەنجومەنی بەڕێوەبردنەوە بە زۆرینەی دەنگ هەڵدەبژێرێت.

سێیەم : دەستەی كارگێڕی

پێكدێت لە سەرپەرشتیاری گشتی و یاریدەدەرەكان و بەرپرسی بەشەكان.

ئەرك و مافەكان:

١. مانگانە كۆبونەوەی ئاسایی خۆی دەكات

٢. بڕیارەكان بە زۆرینەی دەنگ دەدات.

٣. ئامادەكردنی رەشنووسی پلانی ساڵانەی ئینستتیوت و پێشنیاركردنی بۆ بۆردی راوێژكاری.

٤. چاودێری و بەدواداچوونی پرۆژەكان.

٥. لێپیچینەوە لە بەرپرسی بەشەكان و نووسینگەكان و ئینستتیوتەكان.

٦. شەش مانگ جارێك پێداچوونەوەی گشتی ئەنجام دەدات.

٧. پێكهێنانی نە بۆ ئەنجامدانی كار و چالاكیەكان.

**چوارەم: ئەنجومەنی بەڕێوەبردن**

سەرەڕای دەسەڵاتەکانی پەیڕەوی ناوخۆ ئەم دەسەڵاتانەشی هەیە:

١. هێڵە گشتیەکانی کاری بانگخوازی دیاری دەکات لە قۆناغە جیاجیاکاندا.

٢. هەموارکردنەوەی هێڵە گشتیەکانی رونیاو کار، یان پەیام و پێڕەو.

٣. ئامادەکردنی رەشنووسی نەخشەی ساڵانە بۆ بەردەم بۆردی راوێژکاری.

٤. هەموارکردن و پەسەندکردنی پلانی ساڵانە

٥. مانگانە کۆبونەوەی خۆی ئەنجام دەدات.

٦. وەرگرتن یان لابردنی ئەندامان بە زۆرینەی دەنگ.

٧. کردنەوەی نووسینگەی تازە.

٨. دانان یان لابردنی بەرپرسی نووسینگە و لقەکان.

٩. بڕیاری ئەنجامدانی کۆنفرانس و سیمینار و ۆرکشۆپی زانستی و پەروەردەیی.

**پێنجەم: بۆردی راوێژکاری**

بۆردی ڕاوێژکاری : پێکدێت لە کەسانی پسپۆڕ و شارەزا لە بواری بانگەواز و پەروەردەی ئیسلامی، ژمارەیان لە لایەن ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی ئینستتیوتەوە دیاری دەکرێت بە رەچاوکردنی پێگەی خوشکان و دابەشیوونی جوگرافی شارەکان.

**ئەرك و مافەکان:**

١. پەسەندکردنی پلانی ساڵانەی ئینستتیوت بە زۆرینەی دەنگ.

٢. بە پرۆژە و پێشنیاز هاوکاری ئەنجومەنی بەڕێوەبردن و دەستەی کارگێڕی دەکات.

٣. لە کار و چالاکیەکانی ئینستتیوتدا بەشداری دەکات.

٤. بۆیان هەیە بەشداری بکەن لە درووستکردنی بەشەکاندا.

٥. مافی بەشداریان هەیە لە پێکهێنانی ئەنجومەنی نووسینگە و لقەکاندا.

٦. هەوڵدان بۆ پەیداکردنی کۆمەکی دارایی بۆ کار و چالاکیەکانی ئینستتیوت.

٧. کێشە و گرفتی بانگەوازیی سنورەکەیان دەگەیەننە ئەنجومەنی بەڕێوەبردن، بە مەبەستی چارەسەرکردن.

٨. گفتوگۆکردن و پێشنیار بۆ دانانی هێڵە گشتیەکانی کاری بانگەواز لە هەرێمی کوردستاندا.

٩. شەش مانگ جارێك کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی دەکات.

شەشەم: بەشەکانی ئینستتیوت:

یەك : بەشی دارایی

دوو: بەشی بەڕێوەبردن

سێ: بەشی ئیرشاد و راگەیاندن

چوار: بەشی گفتوگۆ و پەیوەندیە گشتیەکان.

پێنج: بەشی پرۆژەکان و پەروەردەی هاوچەرخ

شەش: بەشی توێژینەوە و تازەگەری

حەوت: بەشی کاروباری گەنجانی بانگخواز

هەشت: بەشی گروپی دیدات.

یەك: بەشی دارایی

پێکدێت لە: بەرپرسێك و دوو کەسی کارگێڕ.

ئەرك و مافەکانیان:

١. کۆکردنەوەی بەخشینی مانگانەی ئەندامان

٢. تۆمارکردنی داهات و خەرجیەکان و تۆمارکردنی سامانی گواستە و نەگواستەی ئینستتیوت.

٣. رەزامەندی ئەدات لەسەر تێچوونی پرۆژەکانی ئینستتیوت

٤. سەرپەرشتی دارایی بەش و نووسینگە و لقەکان ئەکات

٥. کۆکردنەوەی کۆمەك و یارمەتی بۆ ئینستتیوت

٦. سەرپەرشتی پرۆژە ئابووری و داراییەکانی ئینستتیوت ئەکات

٧. وردبینی سالآنەی خەرجی و داهاتەکان ئەکات

٨. لە مانگی یازدەی هەمووساڵێکدا راپۆرتی سالآنەی دارایی ئەخاتە بەردەم ئەنجومەنی بەڕێوەبردن کە لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت، داهات و خەرجی ساڵی رابردوو+ دیاریکردنی بودجەی ساڵی داهاتوو.

دوو: بەشی ئیدارە(بەڕێوەبردن)

پێکدێت لە بەرپرسێك و یەك کەسی کارگێڕی.

ئەرك و مافەکانیان:

١. تۆمارکردن و ناونووسکردنی ئەندامان بەم شێوەیەی خوارەوە و پاراستنیان لە تۆمارێکی تایبەتدا: ( ناو، ناونیشان، تەمەن، پیشە، ڕەگەز، ڕۆژی بوون بەئەندام، پلەی خوێندن، باری خێزانی.هتد ).

٢. تۆمارکردنی ناو و دەستەی دامەزرێنەرانی ئینستتیوت لە تۆمارێکی تایبەتدا.

٣. پاراستنی تۆماری بڕیارەکان.

٤. ڕێکخستنی خەفارەت و دەوامی ئەندامانی دەستەی کارگێڕی.

٥. ئامادەکردنی بەرنامەی کۆبوونەوەکان بە هەماهەنگی لەگەڵ سەرپەرشتیاری گشتی ئینستتیوتدا.

٦. سەرپەرشتی دۆسیەی هاتوو ــ دەرچوو دەکات.

٧. ڕاپۆرتی مانگانە ئامادە دەکات.

٨. سەرپەرشتی تۆمارەکانی ئینستتیوت دەکات.

٩. دەرکردنی ناسنامەی ئەندامان.

سێ: بەشی ئیرشاد و ڕاگەیاندن

پێکدێت لە لێپرسراوی بەش و دوو کەسی کارگێڕی و بەرپرسانی بەشەکانی ڕاگەیاندن لە هەموو نووسینگەکاندا..

ئەرك و مافەکانیان:

١. بەرپرسە لە بەرەوپێشبردنی راگەیاندنی ئینستتیوت، بە هەرسێ جۆری( دەنگی و رەنگی و ئەلیکترۆنی).
٢. بەرپرسە لە هەموو جۆرە کار و چالاکیەکی ئینستتیوت لە بواری راگەیاندندا.
٣. بەرپرسە لە سایت و پەیجی ئینستتیوت و بەرەو پێشبردنی .
٤. دەرکردنی گۆڤار و کتێب و پرۆشەر و بلاْوکراوەی دیواریی.
٥. مانگانە راپۆرتی خۆی بەرزدەکاتەوە بۆ دەستەی کارگێڕی.
٦. سەرپەرشتی کەناڵی نێوخۆیی و ئاسمانی ئینستتیوت ئەکات.
٧. سەرپەرشتی چالاکی ئەدەبی و هونەری ئەکات لەناو ئینستتیوتدا.
٨. دەرکردنی رێنمونی و ئاراستەی رۆحی و سلوکی بۆ زیندووراگرتنی بەها بەالاکانی ناو خەڵکی.

چوار: بەشی گفتوگۆ و پەیوەندییە گشتیەکان:

پێکدێت لە بەرپرسێك و لێپرسراوی بەشەکانی پەیوەندیەکان لە نووسینگەکاندا

ئەرك و مافەکان:

١. بەرپرسە لە بەرەوپێشبردنی پەیوەندییەکانی ئینستتیوت لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکان
٢. سەرپەرشتی دۆسیەی پەیوەندییەکان دەکات و پلان بۆ بەرەوپێشبردنیان دادەنێت.
٣. دروستکردنی تۆڕێکی پەیوەندی بە بانگخوازانی دەرەوەی هەرێم بە مەبەستی سوود وەرگرتن لە توانا و ئەزمون و پسپۆڕیان.
٤. مانگانە راپۆرتی خۆی بەرزدەکاتەوە بۆ ئەنجومەنی بەڕێوەبردن.

٥. کردنەوەی دەروازەی گفتوگۆ لەگەڵ کەس و لایەنە پەیوەندیدارەکاندا.

پێنج: بەشی پرۆژەکان و پەروەردەی هاوچەرخ

پێکدێت لە: بەرپرسێك و ئەنجومەنێك لە کەسانی شارەزا لە پرۆژە نووسین و پەروەردەی ئیسلامی هاوچەرخدا.

ئەرك و مافەکانیان:

١. نوسینی پرۆژە بۆ بوارە جیاجیاکانی ئینستتیوت.

٢. بە هاوکاری سەرپەرشتیاری گشتی و ئەندامانی دەستەی کارگێڕی، پارەبەخش(ممولین) دیاری دەکات و پرۆژەی گونجاویان بۆ ئامادە دەکات .

٣. پرۆژەی کورت خایەن و درێژخایەن ئامادە دەکات بۆ فەرمانگە و رێکخراوە ناحکومیەکان بە مەبەستی سودمەندبوون لە ( بەخشینی حکومی ).

٤. مانگانە راپۆرتی خۆی بەرز دەکاتەوە.

٥. ئامادەکردنی بەرنامەیەکی پەروەردەیی هاوچەرخ بە مەبەستی وتنەوەی لە خول و خێوەتگەکاندا و بۆ هەردوو رەگەز.

٦. کردنەوەی پەیمانگای ئەهلی بۆ پێگەیاندنی بانگخوازی تازە و هاوچەرخ.

٧. کردنەوەی سەنتەری تەدەببور و تەحفیز و داهێنانکردن تێیاندا.

٨. هەوڵدان بۆ کردنەوەی خوێندنی ئەلیکترۆنی کراوە.

**شەش: بەشی توێژینەوە و تازەگەری**

**پێکدێت لە:** بەرپرسێك و ئەندامێکی کارگێڕی و ئەنجومەنێك لە کەسانی شارەزا لە توێژینەوەی زانستی و فیکری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و..هتد.

**ئەرك و مافەکانیان:**

١. دانانی بەرنامەی پەروەردەیی و زانستی و ڕۆشنبیری.
٢. ئەنجامدانی توێژینەوە لە بواری زانستە شەرعیەکاندا.
٣. توێژینەوە لەسەر مەسەلە تازەکانی ناو کۆمەڵگا.
٤. کردنەوەی خێوەتگە و خولی زانستی و پەروەردەیی.
٥. کردنەوەی خولی زانستە شەرعیەکان.
٦. دروستکردنی پسپۆڕی لە بوارە جیاوازەکاندا.
٧. ئەنجامدانی کۆڕ و سیمینار و وۆرکشۆپ و بەرنامە لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە .
٨. کۆکردنەوەی نووسەرانی بانگخواز لە ئەنجومەنێکدا و ڕێکخستنی توانا و بەهرەکانیان لە بواری نووسین و وەرگێڕاندا.
٩. ڕاپۆرتی مانگانە بەرز دەکاتەوە.

**حەوت: بەشی کاروباری گەنجان**

پێکدێت لە بەرپرسێك و دوو ئەندامی کارگێڕ و ئەنجومەنێك کە لە نوێنەرانی گەنجانی بانگخوازی نووسینگەکانی شارەکان، بەرپرسی ئەم ئەنجومەنە ئەندامی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی ئینستتیوتی بانگخوازانە.

**ئەرك و مافەکانیان:**

١. جێبەجێکردنی بڕیارو راسپاردەکانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی ئینستتیوتی بانگخوازان

٢. هەماهەنگیکردن لەگەڵ نووسینگەکاندا بۆ جێبەجێکردنی چالاکیەکانی خۆیان و چالاکی نووسینگەکان.

٣. پابەندبوون بە پەیام و پێڕەوی ئینستتیوتی بانگخوازانەوە.

٤. هەڵبژاردنی گەنجانی بەتوانا لە زانکۆ و پەیمانگاو قوتابخانەکاندا بەمەبەستی پێگەیاندنیان لە ڕێگەی ئەو پەیمانگا ئەهلی وخول و خێوەتگانەی ئینستتیوتی بانگخوازان ئەیانکاتەوە.

٥. دابینکردنی بنکە و بوودجە بۆ چالاکیەکانیان لە لایەن ئینستتیوتی بانگخوازانەوە.

٦. بۆیان هەیە هەڵمەتی پیتاك کۆکردنەوە ئەنجام بدەن بۆ چالاکیەکانیان بە هەماهەنگی لەگەڵ بەشی دارایی ئیستتیوتدا.

٧. تەمەنی ئەندامی ئەم بەشە نابێ لە دوازدە ساڵ کەمتر بێت و لە چل ساڵ نابێ تێپەڕ ببێت.

٨. مانگی جارێك دانیشتنی ئاسایی ئەنجومەنی بانگخوازانی گەنج ئەنجام ئەدرێت.

٩. هەموو ئەندامێکی ئەنجومەنی گەنجان ئەبێ بەردەوام لانی کەم دوو قوتابی لابێت پەروەردەیان بکات و بیانکاتە بەرەی دووەمی بانگخوازان.

هەشت: بەشی گروپی دیدات

پێکدێت لە بەرپرسێك و دوو ئەندامی کارگێڕی و بەرپرسانی ژوورەکانی دیدات بۆ توێژینەوە و ساغکردنەوەی بابەتە زانستیەکان، بەرپرسی گروپی دیدات ئەندامە لە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی ئینستتیوتی بانگخوازاندا.

ئەرك و مافەکانیان:

١. گروپی دیدات دوو ئەرکی سەرەکی ئەنجامئەدات: وەلآمدانەوەی گومانەکان بە نووسین و بە مونازەراتی تەلەفزیۆنی و کوڕو سیمنار و وۆرك شۆب، توێژینەوەو ساغکردنەوەی بابەتە زانستی و ئیعجازیەکان بە نووسین و توێژینەوەی مەیدانی.

٢. مانگی جارێك دانیشتنی ئاسایی خۆیان ئەکەن.

٣. مافی داراییان بەسەر ئینستتیوتی بانگخوازانەوە هەیە بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکانیان.

٤. راپۆرتی مانگانە ئەدەنە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی ئینستتیوتی بانگخوازان.

٥. دابینکردنی شوێنی گونجاو بۆ کۆبوونەوە و بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە زانستییە مەیدانیەکانیان.

٦. کردنەوەی خول و خێوەتگە بە هاوکاری نووسینگەی شارەکان.

٧. هەماهەنگیکردن لەگەڵ بەشی توێژینەوەو تازەگەری لە ئینستتیوتی بانگخوازاندا.

**بنەما و یاسا گشتیەکان:**

١. لە گشت دەستە و ئەنجومەنەکانی ئینستتیوتی بانگخوازاندا بە زۆرینە بڕیارەکان پەسەند ئەکرێن.

٢. هەموو بەشەکانی ئینستتیوت بۆیان هەیە ئەندامیان هەبێت لە نووسینگەکاندا و لە کۆی ئەو ئەندامانە ئەنجومەنی بەشەکەیان پێکبهێنن.

٣. هەر ئەندامێك بە بێ پرس و پاساو سێ کۆبوونەوەی لەسەریەك ئامادە نەبێت مافی ئەندامێتی لەو بەشەدا لەدەست دەدات.

٤. هەموو بەشەکان بۆ چاك راپەڕاندنی بەشەکانیان دەتوانن لیژنەی تایبەت و پسپۆڕ دابنێن بۆ بەشەکانیان.

٥. هەموو بەشەکان تۆماری بڕیار و راسپاردەی خۆیان دەبێت.

٦. سوود بینین لە توانا و پسپۆڕی کەسانی دەردەوەی ئینستتیوت لە لایەن بەشەکانەوە.

٧. ئەنجومەنی بەڕێوەبردن دەتوانێت هەمواری کارنامەکان و پەیام وپێڕەو بکات لەکاتی پێویستدا.

٨. هەموو بەشەکان مانگانە کۆبوونەوەی ئاسایی خۆیان ئەکەن.

٩. سەرپەرشتیاری گشتی و یاریدەدەرەکانی بۆ ماوەی چوار ساڵ لە لایەن ئەنجومەنی بەڕێوەبردنەوە بە زۆرینەی دەنگ هەڵدەبژێردرێت.

١٠.لە كاتی کەمتەرخەمی و رانەپەڕاندنی کارەکانی یان لادان لە هێڵە گشتیەکانی ئینستتیوت ئەنجومەنی بەڕێوەبردن بۆی هەیە بە دوو لەسەر سێی ئەندامانی سەرپەرشتیاری گشتی یان یاریدەدەرەکانی بگۆڕێت و کەسانی تر دەست نیشان بکات.

١١.بەشەکان دەتوانن رێکاری پێویست بگرنەبەر بۆ جێبەجێکردنی کار و چالاکیەکانیان.

١٢.مافی لێسەندنەوەی ئەندامێتی تایبەت تەبێت بە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنەوە، ئەویش بە دەنگی دوو لەسەر سێی ئەندامان.

١٣.هەر بەرپرسێکی کارگێڕی لەناو دەستەی کارگێڕیدا لە ماوەی شەش مانگدا نەیسەلماند توانای راپەڕاندنی کارەکانی هەیە، ئەوە دەستەی کارگێڕی بۆی هەیە پێشنیار بکات بۆ ئەنجومەنی بەڕێوەبردن بە مەبەستی گۆڕینیان.

واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

